منتدى إقرأ الثقافي

# کوتانی منداڵان



باسی هەر شەش نەخۆشیە کوشندەکەی منداڵان دەکا
لەگەڵ چۆنیەتی کوتان و خۆپاراستن لێیان








دانانی
د. فەیسەڵ عارەب بلباس

هەولێر / 2012

# کوتانی منداڵان

## باسی هەر شەش نەخۆشیە کوشندەکەی منداڵان دەکا
## لەگەڵ چۆنیەتی کوتان و خۆپاراستن لێیان

دانانی

د. فەیسەڵ عارەب بلْباس

هەولێر ٢٠١٢



**له بڵاوکراوەکانی**

**خانەی ئەربیل بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

0750 89 89 89 0

dar.erbil@gmail.com

ناوی کتێب: کوتانی منداڵان

دانانی: د. فەیسەڵ عارەب بڵباس

چاپی: یەکەم

چاپخانەی: شەهاب

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە سپاردنی

(٢٤٣) ساڵی ٢٠١٢ ی پێدراوە.

# ناوەرۆك



| لاپەرە | بابەت |
|---|---|
| ٤ | پێشكەش |
| ٥ | گوتەیەك |
| ٦ | پێشەكی |
| ١١ | سەرەتا |
| ١١ | یەكەم: هێلەكانی بەرگری سروشتی |
| ١٦ | دووەم: هێلەكانی بەرگری دەستكەوت |
| ١٩ | كورتەیەكی مێژوویی |
| ٢١ | كوتان چیە..؟ |
| ٢٢ | نەخۆشی سیل و كوتانی بی سی جی |
| ٣١ | كوتانی ئیفیلجی مندالآن |
| ٣٨ | كوتانی سێیانە |
| ٣٩ | ١- ملەخرە |
| ٤٣ | ٢- دەردەكۆپان |
| ٥٠ | ٣- كۆخەڕەشە |
| ٥٣ | سۆریكە |
| ٥٧ | گوێ ڕەپە |
| ٥٩ | سۆریكەی ئەڵمانی |
| ٦١ | گوتەی كۆتایی |
| ٦٢ | خشتەیەك بۆ دیاریكردنی جۆر و كات و شوێنی كوتانەكان |

## پێشکەشە بە:

هەموو منداڵە چاوگەشەکانی کوردستان...

# گوتەیەك

منداڵ هەر هی دایك و باوك نیە بەڵكو سامانی نەتەوەیە و هیوا و ئاواتی دوارۆژی گەل و نیشتمانە، بۆیە باش پەروەردەکردن و پێگەیاندنی تەندروستانە و پاراستنی لە نەخۆشیان، هەر ئەرکی دایك و باوك نیە، حکومەت و دامەزراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی و هەموو تاکێکی هەر کۆمەڵێك ئەرکی سەرشانیەتی کە هەوڵ بدا بە باشترین شێوە منداڵ پێبگەیەنێ...

هەر لە روانگەی ئەمەشەوەیە کە ئەم نامیلکەیە نووسراوە و ئامادەکراوە بۆ ئەوەی رێنیشاندەر بێ بۆ هەموان و شارەزای هەندێك لەرێگەکانی پاراستنی تەندروستیی منداڵان بین...بەو هیوایەی سوودی هەبێ بۆ هەموومان بە نەوەکانیشمانەوە.

# پێشەکی

دایکی دڵسۆز...

باوکی بەڕێز...

ئەوا خودای مەزن کۆرپەیەکی جوانکیلەی پێ بەخشین، جگە لەوەی ماڵتان ئاوەدان دەکاتەوە و ژیانتان پڕ هیوا و ئاوات دەکا، دەبێتە هۆی بەهێزتربوونی پەیوەندی نێوانیشتان... لەسەر ئێوەی دایك و باوك پێویستە و بگرە ئەرکێکی سەرشانیشتانە کە ئەم منداڵە بەباشترین شێوە پەروەردە بکەن و لەنەخۆشیان بیپارێزن، بۆ ئەوەی نەوەیەکی تەندروست و زەین ڕوون وچوست و چالاك بێ و پاشەڕۆژێکی گەش و سەرکەوتووی هەبێ.

یەکێك لە ڕێگە هەرە گرنگ و کاریگەریەکانی پاراستنی منداڵ لەنەخۆشیان، کوتانە. کوتان (Vaccination) لەدژی نەخۆشیە درمەکان، دەبێتە هۆی پاراستنی منداڵ لەتووشبوون بەو نەخۆشیە کوشندانە، کە ئەگەر خوای نەخواستە تووشیان هات، ئەگەر نەشبنە هۆی مردنی ئەوا ماك و شوێنەواری ئەوتۆیان

لێ بەجێ دەمێنێ کە بەدرێژایی ژیان ئەو منداڵە و دایك و باوکیشی پێیەوە دەناڵێنن.

لەم نامیلکەیەدا جۆرەکانی کوتان و چۆنیەتی کوتانی منداڵان لە ڕۆژی لەدایك بوونیەوە تا دەچێتە قوتابخانە ڕوون دەکەینەوە، بۆ ئەوەی دایك و باوکان لەچۆنیەتی کوتان و کات و شوێنی کوتانەکان و ئەو نەخۆشیانەی کوتانیان بۆ دەکرێ ئاگادار بکەینەوە تا بتوانن بە باشترین شێوە پەیڕەوی بکەن...

بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ڕێکوپێك منداڵ بکوترێ، باشتر وایە هەر لە ڕۆژی لەدایك بوونیەوە فایلێکی تایبەتی لەماڵەوە بۆ بکرێتەوە و ناو و ڕۆژی لەدایکبوونی لەسەر بنووسرێ و هەرچی نووسین و کارتی کوتان و پسوولە و دەفتەری تەندروستی و بەڵگەنامەی لەدایکبوونی هەیە، هەمووی تێدا بپارێزرێ بۆ ئەوەی کوتانەکانی بە ڕێکوپێکی جێ بەجێ بکرێن و لەکاتی خۆیاندا ئەنجام بدرێن. لەدوا ڕۆژیشدا بۆ ئەو منداڵە دەبێتە بەڵگەنامەیەکی مێژوویی و یادگاریەکی دانسقەش. ڕەنگە لەکاتی نەخۆش کەوتن و چوونە لای پزیشکیش بەکاربێ و تێبینیەکانی تێدا تۆمار بکرێ و زانیاری باشیش لەبارەی منداڵەکەوە بداتە دەست، کە ڕەنگە دایك و باوك

لەبیریان کردبێ. جگە لەوەی ئێستا لەفەرمانگەکان ئەو جۆرە کارت و بەڵگەنامانە داوا دەکرێن و بۆ دەرهێنانی ناسنامە پێویست دەبن. هەروەها لەکاتی کۆچکردن بۆ وڵاتێکی دیکە، هەندێك جۆری کوتان بەپێویست دادەنرێ و ئەگەر منداڵەکە کارتی ئەو کوتانانەی نەبێ ئەوا رێگەی پێ نادرێ بچێتە ئەو وڵاتە.

"دەفتەری تەندروستی" ئەگەر هەبێ زۆر زانیاری تێدایە جگە لەخشتەی کوتانەکان، وەك: چاودێری کردنی کێشی منداڵەکە و درێژی بەژن و باڵا، کە بەزانینی ئەوانە لەسەر خشتەی تایبەتی بەپێی هێڵێکی چەماوە دەتوانین گەشەکردنی منداڵەکە بزانین و لەگەڵ گەشەکردنی سروشتیی تەمەنی خۆی بەراوردی بکەین. دەشتوانین هەبوون یان نەبوونی هەر هەستەوەریەك (حساسیە) بۆ هەندێ دەرمان لەدەفتەرەکەیدا دیاری بکەین و لەهەر سەردانێکی بۆ لای پزیشك دەبێتە بەڵگەیەك و هەڵەی لێ روونادا. دەکرێ جۆری خوێن و تووشبوونی بەهەندێ نەخۆشیی فەکێشی وەك: (شەکرە) لەناو هەمان دەفتەردا تۆمار بکەین بۆ ئەوەی لەکاتی رووداني کارەساتاندا زوو نەخۆشیەکەی بزانرێ و بەپێی

پێویست چارەبکرێ یان خوێنی بدرێتێ بێ ئەوەی پشکنینی تاقیگەی بۆ بکرێ و چارەسەریەکەی دوا بکەوێ.

کوتان ئێستا لەهەموو جیهاندا بەپێویست دادەنرێ، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی کە تەمەنیان لە پێنج ساڵ بەرەو خوارەوەیە. هەر ئەم کوتانانەشە بووەتە هۆی نەمانی هەندێ نەخۆشی کوشندەی وەك (خوریکە، ئاوڵە) لەجیهاندا و کەمبوونەوەی رادەی نەخۆشیەکانی دیکە لەهەندێ وڵاتی تازە پێگەیشتوو و نەمانی ئەو نەخۆشیانە لە وڵاتە پیشەسازیە پێشکەوتووەکاندا بەیەکجاری. دەبێ دایکان و باوکان ئەوەش بزانن کە لەزۆربەی وڵاتان کوتان بە پارە دەکرێ و بەزۆری زۆرداریش دەسەپێنرێ، بەتایبەتی بۆ چەند نەخۆشیەکی درم، بەڵام لەلای خۆمان هێشتا بەخۆڕاییە، کەچی، بەداخەوە، هێشتا هەندێك جار دەبینین منداڵێك یان چەندان منداڵ لەخێزانێکدا لەو کوتانانە بێبەشن یان بەتەواوی نەکوتراون، ئەوەش تەنیا لەبەر کەمتەرخەمی یان نەزانی دایك و باوکیان. ئەو منداڵانە زۆر نزیکن لەتووشبوون بە نەخۆشیە درمەکان و بۆ منداڵانی دیکەش دەبنە مەترسی و رەنگە نەخۆشیەکەیان بۆ بگوازنەوە.

بۆیە، دایك و باوكی بەڕێز: بەكوتانی منداڵەكانتان بە ڕێكوپێكی و لە كاتی دیاركراوی خۆی دا، نەك هەر بەتەنیا منداڵەكانی خۆتان لەنەخۆشی دەپارێزن، بەڵكو منداڵی خزم و ناسیار و جیرانەكانیشتان دەپارێزن، لەبەر ئەوانە كوتانی منداڵەكانتان لەم ڕووەوە دەبێتە ئەركێكی نیشتمانی.

هیواداریـن ئەم نامیلكەیە سوودبەخش بێ و هاندەرێك بێ بۆ دایك و باوكان بۆ پاراستنی جگەرگۆشەكانیان لە دەرد و نەخۆشیان.

ئیتر خودای مەزن هاریكاری هەموو لایەكمان بێ.

# سەرەتا

ئەو دەوروپشت و ژینگەیەی ئێمەی مرۆڤ، تێیدا دەژین پڕە لەهۆکاری نەخۆشیان، وەك: بەکتریا، ڤایرەس، کەڕوو و کرم و گەلێك مشەخۆری دیکە. بۆ نموونە، ئەگەر شوێنێکی لەشمان، چ سەر پێست بێ یان ناودەم و لووت و هەر شوێنێکی دیکەی لەش، لەژێر وردبین (مایکرۆسکۆب) بپشکنین، دەبینین چەندان جۆر میکرۆبی لەسەرە. تەنانەت پاش ئەوەی دەست و چاویشمان بە ئاو و سابوون دەشۆین، هەندێك لەو میکرۆبانە هەر دەمێننەوە.

لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵدەدا، ئەویش ئەوەیە: ئەدی بۆچی لەچاو ئەو هەموو میکرۆب زۆریەی ناو ژینگە و دەوروپشتمان، کەم تووشی نەخۆشیان دەبین..؟ وەڵامەکە ئەوەیە: لەش چەند هێڵێکی بەرگریی خۆڕسکی (سروشتی) هەیە. ئەو میکرۆبانە دەبێ ئەو هێڵانە یەك لەدوای یەك ببڕن پێش ئەوەی بتوانن تووشی نەخۆشیمان بکەن.

هێڵەکانی بەرگری لەش بەم شێوەیەی خوارەوە دابەش کراون:

**یەکەم: هێڵەکانی بەرگری سروشتی:** کە بە بەرگری گشتی یان ناتایبەتی ناودەبرێن و بریتین لە:

ا- رووی دەرەوەی لەش:




پێست وەکو هێڵێکی بەرگریی میکانیکی، رێگە لەچوونە ژوورەوەی میکرۆبان دەگرێ. جگە لەوە، لەسەر رووی دەرەوەی پێست مادەی چەوری ئەوتۆ هەیە کە دەبێتە هۆی کوشتنی بەکتریا. رەنگە ئەو مادانەی سەر پێست: ترشی لاکتیك، ترشی چەوری ناو عارەقەی سەرپێست و گلاندە چەوریەکانی ناو پێست بن. چونکە تێبینی کراوە هەر دوای مردن بەماوەیەکی کورت پێست ئەو توانایەی نامێنێ.

ب- پەردە لینجە ناوپۆشەکانی دەم، لووت، بۆرییەکانی هەناسەدان، ناوچاو و کونی گوێ، میکانیزمی وایان هەیە کە بەهۆیەوە رێگە لەمیکرۆب دەگرن، لەوانە: ئەو مادە لینج و چڵمیەی ناو ئەم شوێنانە میکرۆب دەگرن و گلیان دەدەنەوە و پاشان لەگەڵ فرێدانی چڵم و بەڵغەم فڕێ دەدرێنە دەرەوەی لەش. بێجگە لەمە مادەی ئەوتۆشیان تێدایە کە میکرۆب دەکوژێ، وەك: ئەنزیمەکانی (لایزۆزایم Lysozime) کە دیواری دەرەوەی لەشی بەکتریا دەتوێننەوە و لەئەنجامدا دەتەقێ و بەکتریاکە دەمرێ.

ج- شلەکانی ناوەوەی لەش: وەك خوێن و شلەی لیمفی Lymph، ئەگەر هاتو میکرۆبێك هێڵەکانی بەرگری پێشووی بڕی و چووە ناو لەشەوە، ئەوا لەناو شلەکانی لەشدا مادە و میکانیزمی بەهێزی وا هەن کە زۆر بەخێرایی میکرۆبەکە لەناو دەبەن. یەکێك لەو مادانە دژەتەنەکانن (Antibody). ئەم دژەتەنانە لەجۆرە پرۆتینێکی تایبەت دروست کراون کە لەگەڵ بەرکەوتنیان بە هەر تەنێکی نامۆ، کە پێشتر لەناو لەشدا نەبووە، چ میکرۆب بێ یان شتی دیکەی نازیندوو، ئەوا یەکسەر دەورەی دەدەن و پێیەوە

دەنووسێن و وازی لێ ناهێنن تا لەناوی دەبەن یان لەکاری دەخەن و نایەڵن ببێتە هۆی نەخۆشی یان زیان گەیاندن بەلەش.

زانایان لەو باوەڕەدان کە ئەو دژەتەنانە، کە بە دژەتەنی گشتی یان ناتایبەت ناوی دەبەن (چونکە تایبەت نین بەجۆرە میکرۆبێکی دیارکراو)، لەئەنجامی تووشبوونی لەش بە میکرۆب و تەنی نامۆی ژینگەوە دروست دەبن و وەکو بەرگریەك بۆ لەش لەناو شلەکانی لەش (خوێن، لیمف، شلەی ناو بۆشاییەکانی پریتۆن و دەوری سیەکان و دڵ)دا دەسووڕێنەوە و ناوە ناوەش نوێ دەبنەوە.

بێجگە لەم دژەتەنانە مادەی تایبەت بە لەناوبردنی ڤایرەس هەیە پێی دەگوترێ (ئینتەرفیرۆن) کە تایبەتە بەگرتن و لەناوبردنی ڤایرەسەکان کاتێك کە دەچنە ناو لەشەوە. هەروەها لەناو ئەم شلانەدا خانەی تایبەتمەند هەن بۆ بەرگریکردن و لەناوبردنی میکرۆب و ئەو تەنە نامۆیانەی کە دەچنە ناو لەشەوە، ئەوا ئەگەر بە دژەتەنەکان لەناو نەچوون. ئەم خانانە بە خانەی قەپگر (Phagocyte) ناودەبرێن و لەبنچینەدا بۆ ئەوە دروست بوون کە ئەو بەشانەی لەش کەلوپارچە بکەن کە کاریان تەواو دەبێ و

لەش پێویستی پێیان نامێنێ یان تەمەنیان بەسەر دەچێ یان لەبەر هۆیەك بەكەڵكی لەش نایەن. ئەوانە لە رێگەی ئەو خانانەوە لەناودەبرێن و لەشیان لێ پاك دەكرێتەوە یان سەرلەنوێ لەكەرتوپارچەكانیان سوود وەردەگیرێ بۆ دروستكردنی مادە و خانەی نوێ. لەكاتی هێرش هێنانی هەر تەنێكی بێگانە، چ میكرۆب بێ یان تەنی دیكە، ئەوا ئەو خانانە دەكەونە گیانی و هەڵی دەلووشن و دەیتوێننەوە و لەناوی دەبەن. ئەم خانە قەپگرانە بەشێكن لە خڕۆكە سپیەكانی ناو خوێن. كاری ئەم خانانە زۆر خێرا و كاریگەرە بەجۆرێك لەتاقیكردنەوەیەكدا كە ١٠٠ ملیۆن بەكتریا لەناو یەك ملیلیتر خوێن كراوەتە ناو لەشەوە، دوای تەنیا ١٠ خولەك تەنیا ١٠٠ بەكتریای لێ ماوەتەوە.

تووشبوون بەنەخۆشیان بەهۆی میكرۆبەوە دوای برینی ئەو هێڵە بەرگریانە دەبێ، ئەوەش، واتە برینی هێڵەكانی بەرگری، دەوەستێتە سەر چەند هۆكارێك كە هەندێكیان پەیوەستن بەمیكرۆبی نەخۆشیەكە، وەك: زۆری ژمارەیان و بەهێزی میكرۆبەكە... هەندێكی دیكەیان پەیوەندیان بە لەشەوە هەیە،

لەوانە: ساغی لەش و نەبوونی نەخۆشی و توانای هێڵەکانی بەرگری خۆیان.

پاش ئەوەی میکرۆبەکە توانی بەسەر ئەو هێلأنەدا زاڵ بێ و نەخۆشی پەیدا بکا، لەش لەبەرگری کردنی ناوەستێ، بەڵکو هێڵی دیکەی بەرگری دژی ئەو میکرۆبەی نەخۆشیە، پەیدا دەبن و هەوڵ دەدەن بەسەریدا زاڵ بن، بۆیە لەزۆربەی ئەو بارانەدا نەخۆش پاش تووشبوون بەنەخۆشیەکە ئەگەر چارەسەریش وەرنەگرێ چاك دەبێتەوە. پاش چاکبوونەوەشی بەرگری بۆ ئەو نەخۆشیە لەلەشیدا پەیدا دەبێ و جارێکی دیکە تووشی نابێتەوە. بەمەش دەگوترێ بەرگری دەستکەوت Acquired کە جۆری دووەمی بەرگریە.

**دووەم: هێڵەکانی بەرگری دەستکەوت:** بۆیە بە بەرگری دەستکەوت ناودەبرێ چونکە لەئەنجامی تووشبوون بەمیکرۆبی نەخۆشیەکەوە دەست دەکەوێ و بەسرووشتی لەخۆوە لەناو لەشدا پەیدا نابێ و نیە. ئەم جۆرە بەرگریەش دابەش دەکرێ بۆ:

١- بەرگریی دەستکەوتی چالأك: بۆیەش پێی دەگوترێ چالأك چونکە پاش تووشبوون بەنەخۆشیەك، لەناو لەشدا پەیدا دەبێ و

بەرگریەکەش سرووشتیە (نەك دەستکرد) چونکە لەخۆیەوە لەناو لەشدا پەیدا بووە نەك بەهۆی کوتانەوە. ئەم جۆرە بەرگریە چالاکە دەتوانرێ بەشێوەیەکی دەستکردیش (واتە ئێمە خۆمان وابکەین کە ئەم جۆرە بەرگریە لەلەشدا پەیدابێ) پەیدا بکرێ، بەوەی میکرۆبی نەخۆشیەك بەکار بێنین و دوای ئامادەکرنی بیکەینە لەشی یەکێکی ساغەوە کە پێشتر نەخۆشی ئەو میکرۆبەی تووش نەبووبێ. هەر ئەمەشە کە پێی دەگوترێ (کوتان) کە مەبەستی ئەم نامیلکەیەمانە.

ب- بەرگریی دەستکەوتی سست: ئەم بەرگریە سستە واتە ناچالاکە، چونکە لەبنەڕەتدا لەناو لەشدا و لەخۆوە دروست نابێ بەڵکو لەدەرەوەی لەشەوە لە لابوراتۆر (تاقیگە) ئامادە دەکرێ و لەکاتی پێویستدا بەشێوەی دەرزی دەکرێتە لەشەوە بۆ ئەوەی ئەو کەسە بۆ ماوەیەك لەتووشبوون بەم نەخۆشیە بپارێزرێ. هەر لەم جۆرە بەرگریە، بەرگری زگماکیش هەیە کە لەکاتی گەشەکردنی کۆرپە لەناو منداڵداندا ئەو بەرگریەی کە لەناو خوێنی دایکیدا پەیدا دەبێ و لە رێگەی هاوەڵەوە (مشیمە) دەچێتە ناو خوێنی کۆرپەکەوە و دژی ئەو نەخۆشیە بەرگری لەناو لەشی

کۆرپەکەدا دروست دەبێ. نموونەی ئەو بەرگریەش، کوتانی دایکی دووگیانە بە کوتانی دژی نەخۆشی (گزاز) کە بەرگریەکە سەرەتا لەناو لەشی دایکەکەدا پەیدا دەبێ، پاشان دەگوازرێتەوە بۆ ناو لەشی کۆرپەکە و کە لەدایك دەبێ بۆ ماوەیەك لەتووشبوون بەو نەخۆشیە دەیپارێزی تا ئەو کاتەی کوتانی بۆ دەکرێ و بەرگری خۆی پەیدا دەکا.

دەبێ ئەوەش لەبیر نەکرێ کە کاریگەریی ئەو هێلانەی بەرگریی لەش، بەپێی تەندروستی و خۆراك و بۆماوەیی ئەو کەسە دەگۆڕێ و لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاوازیان هەیە لە رووی توانستیان بۆ نەهێشتنی تووشبوون بە نەخۆشیان.

# کورتەیەکی مێژوویی

زانایان هەر لەکۆتایی سەدەی حەڤدە و سەرەتای سەدەی هەژدەدا تێبینی ئەوەیان کردبوو کە کاتێك یەکێك لەنەخۆشیەك چاك دەبێتەوە، بۆ جارێکی دیکە تووشی هەمان نەخۆشی نابێتەوە، هەرچەندە ئەو نەخۆشیە لەو ناوچەیەدا بڵاوبێتەوە کە ئەو کەسەی تێدا دەژی. پزیشك و زانای ئینگلیزی (ئێدوارد جێنەر ١٧٤٩ – ١٨٢٣) تێبینی کردبوو ئەو ژنانەی ئەو چێڵانە دەدۆشن کە تووشی (خوریکەی مانگا) هاتوون، جگە لەچەند زیپکەیەك لەسەر دەست و پلیان، تووشی خوریکە نابن، یان ئەوانەی تووشی خوریکەی مانگا دەبن پاش چاکبوونەوەیان لێی، تووشی خوریکەی ئاسایی مرۆڤ، نایەن. ئەم تێبینیانە چەند تاقیکردنەوەیەکی بەدواداهات، لەوانە دکتۆر (جینەر) خۆی دەستی کرد بە بەکارهێنانی ئەو شلە و ئاووزڵزلەیەی کە لەناو زیپکەکانی خوریکەی مانگادا هەن و بۆ مرۆڤێکی ساغی گواستەوە و بینی دوای ماوەیەك ئەو کەسە بەرگری لەدژی نەخۆشی خوریکە پەیداکردووە. ئەمە بووە سەرەتایەك بۆ بەکارهێنانی کوتان بۆ خۆپاراستن لەنەخۆشیە درمەکان و ناوی (vaccine)یش هەر

لەمەوە پەیدابوو چونکە (vacca) وشەیەکی لاتینی کۆنە و ماناى مانگا دەگەیەنێ.

پاش نزیکەی سەد ساڵ لەم تاقیکردنەوانە، زانای فەڕەنسی (لویس پاستۆر ١٨٢٢ – ١٨٩٥) لەئەنجامی تاقیکردنەوەکانی خۆیدا، بۆی دەرکەوت کە دەتوانرێ میکرۆبی بێهێز و لاوازکراو بەکاربهێنرێ بۆ ئەوەی لەش بەرگری دروست بکا لەدژی ئەو نەخۆشیەی کە ئەم بەکتریایە پەیدای دەکا. ئەمەش لەئەنجامی ئەو تێبینیکردنەوە هات کاتێك کە بینی میکرۆبی (کۆلێرای مریشك) تواناى دروستکردنی ئەو نەخۆشیەی لەدەست داوە پاش ئەوەی بۆ ماوەیەك لەتاقیگەکەیدا ماوەتەوە لەکاتی پشوودانی ئەم زانایە. دوابەدوای ئەمانە زۆر زانای دیکە بەو زانستەوە خۆیان خەریك کرد تا گەیشتە ئەو ئاستەی ئەمڕۆکە و ڕەوتی پێشکەوتنیشی هەر بەردەوامە. سەرئەنجام ئێستا بەشێکی زۆر لەنەخۆشیە میکرۆبیەکان (درمەکان) کوتانیان هەیە و بەشێکیشیان چاوەڕێی دۆزینەوەی کوتانی باشتر و کاریگەرترن.

هەر کوتانیشە کە بووەتە هۆی لەناوبردنی نەخۆشیی خوریکە لەجیهاندا کە یەکێك بوو لەنەخۆشیە کوشندەکانی وڵاتە هەژار و

دواکەوتووەکان، تا ساڵانێکی نزیکیش بەملیۆنان منداڵان تووشی ئەم دەردە دەبوون و زۆریشیان دەمردن.

**کوتان چییە..؟** کوتان یان ڤاکسین (یان وەکو هەندێك جار ناوی دەنێن پێکوتە) بریتیە لەهۆکارێکی زیندووی بێهێز و لاوازکراو یان مردووی نەخۆشیەك یان ژەهری ئەو هۆکارە یان تەنیا بەشێك لەپێکهاتەی لەشی ئەو هۆکارەی نەخۆشیەکە، کە بەشێوەیەك ئامادە و پاك کراوەتەوە کە لەکاتی کردنە ناو لەشەوە، چ بەدەرزی بێ یان لە رێگەی دەمەوە، بەهۆی کاردانەوەی لەش بۆ ئەو مادە نامۆیە دژەتەن دروست دەبێ و دەبێتە بەرگریەك لەدژی ئەو نەخۆشیەی کە ئەم هۆکارە پەیدای دەکا. ئەمڕۆ کوتان بە بەهێزترین چەکی تازەی زانستی پزیشکی لەدژی نەخۆشیەکان دادەنرێ و بەسوودترین چارەسەریشە، ئەگەر بەراورد بکرێ لە رووی هەرزانی دروستکردن و کاریگەریەکەی بۆ ئەو نەخۆشیە کوشندانەی کە تووشی مرۆڤ دێن. لەهەمان کاتدا یەکێکە لەگرنگترین رێگەکان بۆ کەمکردنەوەی رێژەی مردنی منداڵان. و نەهێشتنی تووشبوون و پەککەوتەبوونیان، بەتایبەتی ئەگەر زوو و لەتەمەنێکی بچووکدا بیان درێتێ.

ئەو نەخۆشیانەی کە کوتانیان بۆ دەکرێ زۆرن، بەڵام چەند نەخۆشیەکی ناسراو و کوشندە هەن کە دەبنە هۆی مردن و پەککستنی منداڵان، ئەمانە وایان لە رێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) و (یونیسێف) کردووە ساڵانە بەرنامەیەکی بەربڵاوی بۆ دارێژن بۆ دابینکردنی کوتان بۆ منداڵان و هەوڵ دەدرێ هەموو منداڵانی جیهان پێش ئەوەی تەمەنیان بگاتە پێنج ساڵ لەدژی ئەو نەخۆشیانە بکوترێن، بەتایبەتی لەساڵی یەکەمی تەمەنیاندا. ئەو نەخۆشیانەش ئەمانەن:

١- سیل، بەتایبەتی سیلی سیپەلاکەکان.

٢- گەرووخرِە.

٣- کۆخەڕەشە.

٤- دەردەکۆپان (کەزان).

٥- ئیفلیجی منداڵان.

٦- سۆریکە.

٧- گوێ ڕەپە (نکاف).

٨- سۆریکەی ئەڵمانی.

# نەخۆشی سیل و کوتانی بی سی جی



ئەمە یەکەم کوتانە کە بۆ منداڵی تازە لەدایکبوو دەکرێ، ئەم کوتانە بۆ ئەوەیە لە دواڕۆژدا منداڵەکە لە نەخۆشی سیل (دیق، وەرەم Tuberculosis) بپارێزێ. نەخۆشیی سیل دەردێکی ڤەکێشە (درێژخایەنە) و بەهۆی جۆرە بەکتریایەکی شێوە درێژۆوکانیەوە (Bacillus) بلاّودەبێتەوە کە ناوە زانستیەکەی Tubercul Bacillus. ئەم نەخۆشیە بەزۆری تووشی سیپەلاکەکان دەبێ و لە رێگەی هەناسەدان و لە دەم و لووتەوە دەچێتە ناو لەشەوە و سەرەتا بە کۆخەیەکی وشك نیشانەکانی دەست پێدەکەن، لەپاشان

بەڵغەمیش پەیدا دەبێ و دوایی کە نەخۆشیەکە پەرەدەستێنێ، خوێنیشی لەگەڵ دێ. ئەگەر زوو چارە نەکرێ ئەوا شانەکانی سیپەلاکەکان دادەگرێ و هەمووی لەناو دەبات و نەخۆشەکە وردە وردە بێهێز و لاواز دەبێ تا دەمرێت. هەندێك جاران نەخۆشیی سیل تووشی بەشەکانی دیکەی لەشیش دێت وەك: ئێسك، بەتایبەتیش ئێسکەکانی بڕبڕەی پشت، گرێی لیمفاوی، بەتایبەتی ئەوانەی دەکەونە ئەملا و ئەولای مل. ریخۆڵەکانیش رەنگە ئەم نەخۆشیە بگرن. ئەمە بێجگە لە گورچیلە و پێست و زۆر شوێنی دیکەی لەش کە بەشێوەیەك لەشێوەکان تووشی دەبن.

چارەکردنی نەخۆشی سیل زۆر زەحمەتە و ماوەیەکی دووروودرێژ و دەرزی و دەرمانێکی زۆری دەوێ و زۆربەی دەرمانەکانیش کاردانەوی لابەلایی لە لەش پەیدا دەکەن، بۆیە کوتان بۆ ئەو نەخۆشیە زۆر پێویستە. لەبەر ئەوەی زۆر بڵاوە، لە وڵاتە هەژار و دواکەوتووەکاندا وا بەباش دەزانرێ کە هەر لە هەفتەی یەکەمی تەمەنی دا، منداڵ دژی ئەم دەردە بکوترێ، پێش ئەوەی تووشی هیچ میکرۆبێکی ئەم نەخۆشیە بێت لەو ژینگەیەی کە تێیدا گەورە دەبێ، چونکە لەو وڵاتانەدا، کە وڵاتی

ئێمەش دەگرێتەوە، نەخۆشیی سیل زۆر بلاوە و میکرۆبەکەی لە هەموو شوێنێکدا هەیە.

کوتان یان (ڤاکسینی بی سی جی) بریتیە لە بەکتریای نەخۆشیی سیلی مانگا (بەکتریای سیلی مرۆڤ جیاوازە لە هی مانگا هەرچەندە ئەویش هەندێك جاران تووشی مرۆڤ دەبێ). ئەم بەکتریایە بەجۆرێك پەروەردە و ئامادەدەکرێ لە تاقیگەدا کە لەبارێکی نەمرونەژیدا (Attenuated) دەمێلرێتەوە، واتە بەکتریایەکە کە دەکرێتە ناو لەشەوە پاش کوتان، توانای ئەوەی نامێنێ نەخۆشی پەیدا بکات، بەلام لەش وەکو ئەو بەکتریایەی سیلی مرۆڤان رەفتاری لەگەلدا دەکات و بەگژیدا دەچێت و دەبێتە هۆی هوشیارکردنەوە و واگاهاتنی سیستەمی بەرگریی لەش و رووبەرووی دەبێتەوە و وەکو ئەوە وایە کە منداڵەکە تووشی نەخۆشیەکە هاتبێ، بەلام هیچ نیشانەیەکی نەخۆشیەکەی لێ بەدیار ناکەوێ. بەم شێوەیە لەشی منداڵەکە و سیستەمی بەرگریی لەشی، خانەی لیمفاویی تایبەت لەناو خوێنیدا بەرهەم دێنێ کە بۆ بەرەنگاربوونەوەی میکرۆبی سیلی مرۆڤان ئامادە کراون و پاش کوتانەکە بە ماوەیەکی کەم ئەو منداڵە ئەگەر

میکرۆبی سیلی مرۆڤانیشی بچێته لەشەوە، ئەوا دەناسرێنەوە و لەناو دەبرێن و تووشی نەخۆشیەکە نایەت.

ناوی کوتانەکە بریتیە لە سێ پیتی زمانی ئینگلیزی کە هەر یەکەیان سەرەتای ناوێکە، ئەوانیش Bacillus کە بە میکرۆبە شێوە چوکڵەییەکە دەگوترێ و وشەکەش لە بنچینەدا لاتینیە. وشەی Calmette ناوی زانایەکی فەرەنساویە (١٨٦٣ — ١٩٣٣) کە لەو بوارەدا کاری کردووە و Guerin یش هەر ناوی پزیشکێکی پسپۆڕی نەشتەرگەریی فەرەنساویە (١٨١٦ — ١٨٩٥). ڤاکسینەکە BCG لە کارگەدا وەکو تۆزێکی سپی زەردباوی وشك کراوە ئامادەدەکرێ و لەناو شووشەیەکدا هەڵدەگیرێ و لە شووشەیەکی دیکەشدا ئاوی تایبەتی خۆی لەگەڵ دادەنرێ. ئەم تۆزە بە ئاوەکەی خۆی پێش کوتانەکە دەگیرێتەوە و هەر شووشەیەی بەشی (٢٠) کوتانان دەکات. واتە بۆ بیست منداڵ دەبێ. بۆ هەر کوتانێکیش هەر منداڵەی کە تەمەنی لەنێوان یەك هەفتە تا یەك مانگ بێت، بڕی نیو لە دەی سی سیەکی (٠٫٠٥ س س ) لە سرنجی تایبەت بۆ رادەکێشرێت و لەسەر شانی چەپەی بەبەری لای قۆڵیەوە — نەك ملی — دەکرێتە ناو

پێستیەوە – نەك بن پێست – . پێشتر دەبێ شوێنی دەرزیەکە بە ئاو و سابوون پاك کرابێتەوە و نابێ سپرتۆ یان مادەی لەم جۆرانە بەکاربهێنرێت، بۆیە باشتر وایە دایکەکە لەماڵەوە شوێنەکە بشوات، پێش ئەوەی بۆ کوتانی ببا. لەکاتی کوتانەکە نووکی دەرزیەکە دەکرێتە ناو پێستەوە و شلەی ڤاکسینەکەی تێدەکرێ. بۆ ئەوەی دڵنیا بی کە لەناو پێست کراوە نەك ژێر پێست، دەبێ شوێنی نووکە دەرزیەکە هەڵاوسێ و کونکونی وەك پەلکە پرتەقاڵ دەرکەوێ. ئەمە مانای ئەوەیە شلەکە چۆتە ناو پێستەکەوە. چونکە ئەگەر کوتانەکە بکرێتە ژێر پێستەوە، ئەوا لەدوایی دا برینێکی گەورە لە شوێنەکەی پەیدا دەبێ کە زۆر درەنگ سارێژ دەبێت و کوتانەکەش سوودی نابێ. ئەگەر بەلای قۆڵی منداڵەکەوە کوترابێ ئەوا گرێ لیمفاویەکانی بن هەنگڵی ئەستوور دەبن، بەلاّم ئەگەر لە نزیك ملیەوە بدرێ ئەوا گرێیەکانی لای ملی دەئاوسێن.

پاش دوو تا سێ حەفتان لەکوتانەکە، شوێنەکەی قینچکە (زیپکە)یەکی رەقی لێ پەیدا دەبێ کە ئێشی نیە. پاش چوار تا شەش حەفتەش ئەم زیپکەیە دەمی دەکرێتەوە و وەك برینێکی

بچووکی لێدیٚ. لەدواییدا کە ڕەنگە چەند مانگێکیش بخایەنیٚ (تا شەش مانگ)، چاك دەبێتەوە و شوێنی قەتماغەکە وەکو پەڵەیەکی سپی هەر دەمێنیٚ. ئەوە مانای ئەوەیە کە کوتانەکە دروست بووە و سەری گرتووە. ئەگەر دوای ماوەیەك، بەتایبەتی لەکاتی کوتانی منداڵی مانگ و نیو یان دوو مانگان دا، هیچ شوێنەوارێکی کوتانەکە لەسەر شانی منداڵەکە دەرنەکەوت، ئەوا مانای وایە کوتانەکەی سەرنەکەوتووە و دەبیٚ جارێکی دیکە بکوترێتەوە، بەڵام ئەوجارە سەرشانی ڕاستەی بەکار دەهێنریٚ.

واباشە دوای کوتانی (بی سی جی) بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك منداڵەکە نەشۆریٚ، بۆیە شوشتنی پێش کوتان باشە، چونکە لەلایەك شوێنی کوتانەکە پاك دەبێتەوە و لەلایەکی دیکەشەوە ئەو چەند ڕۆژەی دوای کوتانەکەش بە پیسی نامێنێتەوە.

هیچ هەنجەت و هۆکارێکیش نیە کە ڕێگە لەو کوتانە بگریٚ، تەنانەت کۆکە و زگچوونیش نابنە ڕێگر. تەنیا ئەو منداڵانە بەو کوتانە ناکوترێن کە تووشی نەخۆشیی نەمانی بەرگری هاتوون ئەوجا لەبەر هەر هۆیەك بێت، یان ئەوانەی دەرمانی سستکردنی بەرگری لەش (وەك: کۆرتیزۆنەکان) وەردەگرن، یان ئەو

منداڵانەی سووتاون یان نەخۆشیی پێستیان هەیە، هەروەها ئەو منداڵانەش کە دەرمانی جۆری (INH) بەکاردێنن کە دەرمانێکی دژە میکرۆبی سیلە، یان هەر دەرمان و چارەسەریەکی کە بەرگریی لەش لاواز دەکات. پێشتر پێویستە بەلای کەم بۆ ماوەی سێ مانگان ئەو دەرمانانە رابگیرێن ئەوجا کوتانەکەی بۆ بکرێ. ئەوانەش دەبێ پزیشك دەست نیشانیان بکات و لەژێر چاودێری ئەودابن.

ئەو منداڵانەی کە لە مانگی یەکەمی تەمەنیان ناکوترێن دەبێ بڕی کوتانەکەیان دوو ئەوەندەی منداڵی یەك مانگی و بچووکتر بێت، واتە بڕی یەك لە دەی سی سیەك (١ر٠ س س) بێت، نەك نیو لە دە. کوتانی (بی سی جی) زۆر بەکارە و لە سەداسەد بەرگری لەش دژی میکرۆبی سیل، بەهەموو جۆرەکانیەوە، پەیدا دەکا. بۆیە دایك و باوکان پێویستە لەسەریان لە حەفتەی یەکەمی تەمەنی، کۆرپەکەیان بگەیەننە یەکێك لەو بنکە تەندروستیانەی کوتانیان لێ دەکرێ بۆ ئەوەی لەدژی نەخۆشی سیل بیکوتن. لەهەمان کاتدا ئەمڕۆ کوتانی دژەسیل یەکێکە لە پێداویستیەکانی

دەرهێنانی ناسنامەی منداڵبوون و کەسێتی و کوتانەکەش بەخۆڕاییە و هیچی تێناچێ.

لەلایەکی دیکەوە مزگێنی دەدەمە ئەو باوك و دایکانەی کە منداڵەکانیان بەم کوتانە دەکوتن، زانستی پزیشکی لەم دواییەدا سەلماندوویەتی کە ئەم کوتانەی سیل منداڵان لە تووشبوون بە شێرپەنجەی خوێنیش دەپارێزێ، لێکۆڵینەوەش بەردەوامە لە بەکارهێنانی ئەم کوتانە بۆ چارەکردنی هەندێك جۆری دیکەش لە شێرپەنجەکان.

# کوتانی ئیفیلجی منداڵان



ئەم نەخۆشیە بۆیە پێی دەگوترێ (ئیفلیجی منداڵان) Poliomyelitis چونکە لە وڵاتە دواکەوتووەکان دا پتر لە منداڵان دەبینرێ، بەڵام لەو وڵاتانەی کە پێشکەوتوون و خزمەتگوزاریی تەندروستیان تێدا بەرزە، لە گەوران پەیدا دەبێ. ئەمەش لەبەر ئەوەی پاك و خاوێنن و منداڵەکانیان لە میکرۆبی ئەو دەردە دوورن، بۆیە ئەگەر بە گچکەیی نەکوترێن، ئەوا بەرگری لەدژی ئەو نەخۆشیە لە لەشیاندا پەیدا نابێ و کە گەورە دەبن، ئەگەر تووشی میکرۆبەکە بوون ئەوا ئەو دەردە دەگرن. ئێستا و دوای پەیدابوونی کوتان رێژەی ئەم نەخۆشیە لەو وڵاتانەدا زۆر کەم بۆتەوە و بە دەگمەن یەکێك تووشی دەبێ.

هۆکاری ئەم نەخۆشیەی ئیفلیجی منداڵان ڤایرەسە Virus کە بە قەبارە لە بەکتریا بچووکترە و بە مایکرۆسکۆبی ئەلیکترۆنی نەبێ نابینرێ. ئەم ڤایرەسە سێ جۆری سەرەکیی هەیە کە ناونراون A, B, C و هەرسێکیان نەخۆشیی ئیفلیجی منداڵان پەیدا دەکەن. ڤایرەسەکان لە رێگەی پرپشکی دەم و هەناسە و خواردن و خواردنەواندا دەگوازرێنەوە و لەناو پیسایی نەخۆش دا هەن، بۆیە پیسایی نەخۆش هەڵگری ئەو میکرۆبەیە و بە سەرچاوەیەکی گرنگی تووشبوون بەو دەردە دادەنرێت. میکرۆبەکە کە دەچێتە ناو کۆئەندامی خواردن یان هەناسەدان، لەوێوە دەپەرێتەوە بۆ ناو خوێن و لە رێگەی ئەویشەوە بۆ ناو مێشك و دەمارەکان دەچێ و لەناو خانەی سەرەکیی دەمارەکاندا (دەمار وەکو لقێك وایە کە لەلەشی خانە سەرەکیەکەوە درێژ دەبێتەوە و خانەی سەرەکیی دەماریش بەزۆری دەکەوێتە ناو مێشك و موخەپەت "الحبل الشوکی") گەشە دەکا و زۆر دەبێ تا خانە سەرەکیەکە لەناودەبا، ئەوەش دەبێتە هۆی پچڕانی ئەو تەزووەی کە لە مێشك و موخەپەتەوە لە رێگەی دەمارەکانەوە بۆ ماسولکەکان دەگوازرێنەوە. کە دەمار لەکار دەکەوێ

ماسوولكەش ناتوانێ بجوولێتەوە و كاری خۆی بكا. ئەو شوێنەی كە دەمارەكەی لەكار كەوتووە جووڵەی نامێنێ و ئیفلیج دەبێ.

بەزۆری ئەو دەمارانەی كە دەكەونە بەر هێرشی ڤایرەسی ئیفلیجی ئەو دەمارانەن كە ماسوولكەكانی دەست و قاچەكان دەجولێنن، بۆیە بەزۆری دەبینین قاچێكی یان دەستێكی یان هەردووكیانی ئیفلیج بوون، یان تەنیا چەند ماسوولكەیەك لە قاچ یان دەستێك لەكار كەوتوون و ئەو كەسە بەباشی ناتوانێ بیانجولێنێتەوە.

ترسناكی ئەو دەردە لەوەدایە كە نەخۆشەكە هیچ نیشانەیەكی نەخۆشیەكەی لێ دەرناكەوێ یان هەر تەنیا نچەتایەكی سووك دەگرێ كە وادەزانرێ هەلأمەتێكی ئاساییە و پاش ماوەیەك دەست بە شەلین دەكات – ئەگەر پێرۆكە بێ – ، ئەو كاتەش هیچ چارەیەكی لەگەڵ ناكرێ، بۆیە باشترین چارەسەری بۆ ئەو دەردە بەرگری كردنە لە تووشبوون، ئەویش تەنیا لە رێی كوتانی تایبەت بەو دەردەوە دەكرێ. كوتانی (ڤاكسین) ئیفلیجی مندالأن بریتیە لە هەر سێ جۆری ڤایرەسەكە كە بەشێوەیەك پەروەردە و ئامادەكراون كە توانای پەیداكردن و تووشكردنی نەخۆشیەكەیان لەدەست داوە، بەلأم سیستەمی

بەرگری لەش دەورووژێنن و لەناو لەشدا بەرگری بۆ میکرۆبەکە پەیدا دەبێ. ڤایرەسە نیوەمرەکان لەناو شووشەی تایبەتی و لە شلەیەکدا ئامادەدەکرێن کە بەشێوەی دڵۆپ دەکرێنە ناو دەمی منداڵانەوە. بەلای کەم هەر منداڵەی دەبێ لەساڵی یەکەمی تەمەنیدا سێ فڕ (جرعه) لەو شلەیە وەربگرێ، هەر فڕەی بریتیە لە دوو تا سێ دڵۆپ، کە راستەوخۆ دەکرێتە ناو دەمیەوە و دەبێ قووتی بدا و نەیتفێنێتەوە. هەر فڕەی نزیکەی یەك ملیۆن دانە لەڤایرەسی جۆری (A) و سەدهەزار دانە لە ڤایرەسی جۆری (B) و سێسەدهەزار دانەش لە ڤایرەسی جۆری (C) تێدایە، هەر فڕەی نزیکەی یەك لە دەی (١و٠) ملیلیترێك (سی سی) دەبێ.

کوتانەکە زۆر هەستیارە بۆ گەرمی، بۆیە دەبێ لە پلەی گەرمی ژێر سفر دا هەڵبگیرێ، ئەگەر بۆ ماوەیێکی درێژ بەکار نەهات و مایەوە، یان لە پلەی گەرمی ٤ی سەدیدا بێ، ئەگەر تەنیا بۆ ماوەی دوو سێ مانگان مایەوە. پاش کردنەوە و بەکارهێنانی تەنیا بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك لە پلەی گەرمیی ئاسایی ژووردا (١٨ — ٢٠) توانای کارکردنی دەمێنێ و ئەگەر لەوە پتر مایەوە ئەوا نابێ بەکار بهێنرێت چونکە لەناو دەچێت.

ئێستا له وڵاتی خۆمان و لەژێر رۆشنایی بڕیارەکانی رێکخراوی تەندروستی جیهانی و بەپێی بەرنامەی رێکخراوی یونیسێف، هەر منداڵەو دەبێ له هەفتەی یەکەمی تەمەنیدا، لەگەڵ کوتانی سیل (بی سی جی) دوو دڵۆپ له کوتانی ئیفلیجی بدرێتێ. ئەمە بە فڕی سفر دادەنرێت، پاش ئەوەی منداڵەکە تەمەنی دەگاتە مانگ و نیوێك یان شەش هەفتە، فڕی یەکەم وەردەگرێ که لەهەمان کاتدا کوتانی سێیانەشی بۆ دەکرێ (که دوای ئەوە دێینە سەر ئەوانیش). پاش فڕی یەکەم بە یەك مانگ یان چوار حەفتە، فڕی دووەم وەردەگرێ و پاش ئەویش بە مانگێکی دیکە فڕی سێیەم. نێوانی فڕەکان چوار حەفتە کەمتر نابێ. بەم شێوەیە کوتان لەدژی نەخۆشی ئیفلیجی منداڵان له ساڵی یەکەمی تەمەنیدا (له چوار مانگی یەکەم) تەواو دەبێ. پاش ساڵێك له فڕی سێیەم که تەمەنی دەبێتە ساڵێك و چوار مانگ، پێویستە فڕێکی دیکەی بدرێتێ بۆ ئەوەی پتر سیستەمی بەرگری لەشی چالاك بکا، بۆیە بەو فڕە دەگوترێ چوستکەر (منشط) Booster Dose. له تەمەنی چوونە باخچە یان قوتابخانەشدا، واتە له تەمەنی چوار یان شەش ساڵیدا وا باشە فڕێکی دیکەی چوستکەری بدرێتێ.

بەم شێوەیە ئەو منداڵە کە تەمەنی دەگاتە پێنج ساڵ بە تەواوی لەدژی نەخۆشیی ئیفلیجی دەکوترێ و بەرگری لە جەستەدا دەگاتە ئەو رادەیەی کە ئەگەر تووشی میکرۆبەکەش بوو ئەوا نەخۆشیەکە ناگرێ.

**تێبینی:** ئێستاش ناوە ناوە رێکخراوی یونیسێف هەڵمەتێکی گشتیی کوتان دژی ئیفلیجی منداڵان ئەنجام دەدا. ئەو هەڵمەتانە پەیوەندیان بەو سیستەمەی پێشەوە نیە و جێی ئەوان ناگرێتەوە. پێویستە لەو هەڵمەتانەشدا منداڵەکە بکوترێ با پێشتریش کوترابێ، چونکە لەکاتی هەڵمەتەکاندا ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە ڤایرەسی نەمرونەژیی ئەو نەخۆشیە بە هەوای شوێنەکەدا بڵاودەبێتەوە و رەنگە ترسی ئەوەیان لێبکرێ منداڵان تووشی نەخۆشیەکە بکەن، ئەگەر لەهەمان کاتدا نەکوترێن. پاش ئەوەی منداڵەکە دووسێ دڵۆپی کوتانەکەی دەکرێتە ناو دەمەوە، دەبێ لەوە ئاگاداربین کە تفی نەکاتەوە بەڵکو دەبێ هەمووی قووت بدا. پاش قووتدانی پێویستە بۆ ماوەی نیو کاتژمێرێك خواردن و خواردنەوە و شیری نەدرێتێ بەتایبەتی شیری مەمك، چونکە خواردنەوەی شیر و خواردن دوای کوتانەکە لەوانەیە ببنە هۆی لەکارخستنی ڤایرەسەکانی کوتانەکە و نەیەڵن باش کاری

خۆیان بکەن، وەکو دەزانرێ شیری دایك دژەتەنی تێدایە بۆ میکرۆبان و ئەگەر ئەو دژە تەنانە چوونە ناو گەدەی منداڵەکە، ئەوا ڤایرەسەکان پەك دەخەن و خواردن و خواردنەوەی دیکەش لەوانەیە کوتانەکە پەرتوبلاو و شل بکەنەوە و لە توانای وورووژاندنی سیستەمی بەرگریی جەستە کەم کەنەوە یان هەر نەیەڵن هەڵبمژرێن. هیچ هەنجەت و هۆکارێك نیە نەیەڵێ منداڵ بەو ڤاکسینە بکوترێ: تا هاتن، کۆخە، زگچوونی کەم... نابنە رێگر و نابێ بەو هەنجەتانەوە منداڵ لەو کوتانە بێبەش بکرێ. ئەگەر زگچوونێکی زۆری هەبوو باشتر وایە چەند رۆژێك کوتانەکە دوا بخرێ تا باشتر دەبێ، چونکە زگچوونیش وا دەکا کوتانەکە ئەوەندە لەناو گەدە و ریخۆڵەکاندا نەمێنێتەوە تا کاری خۆی بکا. لەوانەیە کوتانەکە خۆی ببێتە هۆی تا لێهاتن، بۆیە ئەگەر پێشتر تای هەبوو باشترە چارە بکرێ ئەوجا بکوترێ. بۆ چارەکردنی تای دوای کوتانەکەش دەرمانی دژە تا بەکار دەهێنرێ.

# کوتانی سێیانە

بۆیە بەم کوتانە دەگوترێ سێیانە (Triple Vaccine) چونکە بەیەکجار بۆ سێ نەخۆشیان بەکار دێ. کوتانەکە بەشێوەیەك ئامادەکراوە کە هۆکارەکانی هەر سێ نەخۆشیەکەی تێدایە و کە منداڵەکەی پێ دەکوترێ، وەکو ئەوە وایە کە تووشی هەرسێ نەخۆشیەکان هاتبێ و بەرگری لەبەرامبەر هەرسێکیاندا پەیدا دەکات.



ئەو سێ نەخۆشیەش ئەمانەن:

١- ملەخڕە، وەناق (الخناق) Diphtheria

٢- دەردەکۆپان، شەوە، گەزاز (الکزاز) Tetanus

٣- کۆخەڕەشە، کۆکەڕەشە (السعال الدیکی) Pertusis

ناوه زانستیەکەی ئەم کوتانە بریتیە لە پیتی یەکەمی ناوی هەرسیّ دەردەکە پیّکەوە کە دەکاتە DTP. لیّرە بەجیا باسی هەر یەکە لەو سیّ نەخۆشیە و کوتانەکانیان دەکەین، بەلاّم دەبیّ بزانین کە کوتانەکە بە یەك جار بۆ هەرسیّ نەخۆشیەکەیە پیّکەوە.

**١- ملەخڕە:**

ملەخڕە یانِ ملەخڕیّ (دەفتیریا) بەهۆی جۆرە بەکتریایەك پەیدا دەبیّ کە پیّی دەگوتریّ بەکتریای ملەخڕیّ یان Corynebacterium diphtheriae. میکرۆبەکە شیّوەیەکی دریّژووکانی و سەریّکی کەمیّك خڕی هەیە و لەژیّر وردبیندا وەکو داری دەستی دۆلّەنگیۆ (دەهۆلّ لیّدەر) ( Drum stick) دەردەکەویّ. ئەو بەکتریایە لە ریّگەی هەناسە و پرپیشکی دەمەوە لە یەکیّکەوە بۆ یەکیّکی دیکە دەگوازریّتەوە. لەوانەشە جلوبەرگ و دەستسڕ و شتی دیکەی بەکارهاتووی نەخۆشیّك ببنە هۆی گواستنەوە و تووشبوون. هەندیّك کەس نەخۆشیش نین بەو نەخۆشیە، بەلاّم لەناو قورگ و گەروویاندا ئەو جۆرە میکرۆبە هەلّدەگرن و بۆ خەلّکی دیکەی دەگوازنەوە. لەدوای چوونە ناو

لەشـەوە تـا دەرکـەوتنی یەکـەم نیـشانەی نەخۆشـیەکە (مـاوەی هەڵهاتنی) رۆژێك تـا حـەفت رۆژە. بـەزۆری نەخۆشیەکە سـەرەتا وەکـو پەردەیـەکی شـینباوی چـڵکن لەسـەر شـێوەی چـەرمی دەبغکراو لـەو شـوێنەی بەکتریایەکـەی تێدا رووا‌وە دەردەکـەوێ. بەزۆریش ئەو پەردەیە لـەناو قـورگ و گـەروودا دەبینـرێ. رەنگـە سەرەتا قەبارە و رووبەری ئەو پەردەیە بچووك و تەنك بێ، بـەلام پـاش چـەند رۆژێك پەردەکـە گـەورەتر دەبـێ و لەوانەیـە هـەموو قورگ و گەروو و بۆرییەکانی هەناسەش دابگرێ. پاشـان پەردەکـە زۆر بەتونـدی بـەو شـوێنانەوە دەنووسـێ و بـە لێکردنـەوەی، شوێنەکە بریندار دەبێ و خوێنی لێدێ. پەردەکـە بـە لێوارێکی سـوورهەڵگەڕاو دەورە دەدرێ. ئەمـە تـەنیا لـەو شـوێنەی کـە بەکتریایەکـەی تێدا تەشـەنە دەکا. ترسـناکیی نەخۆشـیەکە لـەو پەردەیـەدا نیـە، بـەڵکو لـەو ژەهـرە دایـە کـە بەکتریایەکـە دەری دەدات و دەیرژێنێتە ناو خوێنی نەخۆشەکەوە، چونکە ئەو ژەهرە Toxin لـە رێـی خوێنـەوە بـەناو هـەموو لەشـدا بڵاودەبێتـەوە و بەزۆری کار دەکاتە سەر دڵ و کۆئەنـدامی دەمـار. لەوانەیـە ببێتـە هـۆی سـووتانەوەی ماسـوولکەکانی دڵ و لـەکاریان بخـا یـان

دەمارەکان لەکاربکەوێنێ، بۆیە نیشانەکانی ئەو دەردە بەزۆری بریتیە لەو نیشانانەی کە ئەم ژەهرە دروستیان دەکا، وەك: تایەکی سووك، دڵەکوتێ، لەکارکەوتنی دەمارەکانی لەش و بێهێزبوونیان... ئەمە بێجگە لەوەی کە پەردەکە هەندێك جار دەبێتە هۆی گیرانی قورگ و نەخۆش هەناسەی پێ نادرێ و خواردنی پێ قووت نادرێ. چارەسەری ئەو نەخۆشیە بەوە دەبێ کە، بێجگە لە پێدانی ئەو دەرمانانەی کە میکرۆبەکە لەناو دەبەن، کاریگەری ئەو ژەهرەش رابگیرێ، ئەویش بەپێدانی دژەژەهری ئامادەکراوی تایبەت کە بەدەرزی دەکرێتە ناو لەشەوە.

لەبەر ئەوەی ترسناکیی نەخۆشیەکە لە ژەهرەکە دایە، بۆیە کوتان بۆ ئەو نەخۆشیە بریتیە لە ژەهری بەکتریایەکە خۆی، کە بەجۆرێك پەروەردە و ئامادەکراوە کە کار لەشانەکانی لەش نەکا و نەبێتە هۆی نەخۆشی، بەڵکو تەنیا وا لە سیستەمی بەرگریی لەش بکا کە خۆی ئامادە بکا و دژە ئەم ژەهرە بەرهەم بێنێ بۆ بەرەنگاربوونەوەی، ئەگەر جارێکی دیکە تووشی ئەو میکرۆب و ژەهرە هاتەوە. بەم جۆرە دژەژەهر لەناو خوێنیدا پەیدا دەبێ و هەر کاتێك ژەهری ئەو بەکتریایە هاتە ناو لەشیەوە ئەوا

بەرەنگاری دەبێتەوە و لەگەڵی یەك دەگرێ و لەكاری دەخا و نایەڵێ بگاتە شانە و دەمارەكانی لەش. ئەم كوتانە لەگەڵ كوتان بۆ نەخۆشیی گەزاز و كۆكەڕەشە پێكەوە دروست دەكرێن و بەدەرزی لە منداڵ دەدرێ و لە تەمەنی شەش حەفتە یان هەشت حەفتە دەست پێدەكرێ. حەفتەی یەكەم دەرزیەكەی لێدەدرێ كە بەزۆری لە بەشی سەرەوەی لای پەرگەی یەكێك لە رانەكانی دەدرێ و دوای مانگێك دەرزی دووەم و پاش ئەویش بە مانگێكی دیكە دەرزی سێیەمی دەبێ لێبدرێ. بەمەش كوتانی ساڵی یەكەمی تەمەنی بۆ ئەو سێ نەخۆشیە (لەگەڵ نەخۆشی ئیفلیجی) تەواو دەبێ. بەڵام بۆ چوستكردنەوەی بەرگریی لەش، باشتر وایە پاش ساڵێك لە دەرزی سێیەم، دەرزیەكی دیكە لەو كوتانە وەربگرێ. بەم شێوەیە منداڵەكە بۆ ماوەی پتر لە پێنج ساڵان بەرگری لە لەشدا دەمێنێتەوە بۆ ئەو سێ نەخۆشیە. ئەگەر لە تەمەنی چوونە باخچە یان قوتابخانە، واتە لە چوار یان شەش ساڵی دا، دەرزیەكی دیكەی چوستكەری لێبدرێتەوە ئەوا بە درێژایی تەمەنی بەرگری دژی ئەو نەخۆشیانەی لە لەشدا دەبێ.

نابێ ئەوەش لەبیر بکرێ کە هەر جارەی دەرزی کوتانی سێیانەی لێدەدرێ، دەبێ دڵۆپی کوتانی ئیفلیجیشیان لەگەڵدا وەربگرێ.

## ٢- دەردەکۆپان:



کەزاز یان دەردەکۆپان نەخۆشیەکی کوشندە و ترسناکە و چارەکردنیشی یەکجار زەحمەتە یان هەر ئەستەمە و بەدەگمەن ئەوەی تووشی بێ بە زیندوویێتی لێی رزگار دەبێ. هۆکاری ئەم نەخۆشیە بەکتریایەکی شێوە درێژووکانیە و لە ژینگەدا زۆر بڵاوە و لە ناو خۆڵ و زبڵ و پیسایی گیاندار و مرۆڤانیشدا هەیە. دەتوانێ لەناو ریخۆڵەکانی مرۆڤدا بژیێ بێ ئەوەی نەخۆشیی لێ پەیدا بکات، چونکە بەکتریایەکە خۆی سستە و شاڵاو و هێرش

ناکاته سەر شانەکانی لەش، بەڵام ئەو ژەهرەی کە دەری دەدا لەکاتی گەشەکردن و زۆربوونیدا دەبێتە هۆی نەخۆشیەکە.

ئەم نەخۆشیە بەزۆری لە ئەنجامی پیسبوونی برینێکی لەشەوە، هەرچەند بچووکیش بێ، بە خۆڵ و زبڵ و پیسایی گیاندارانەوە پەیدا دەبێ، (جێی سەرنجە کە ئێستاش لە دێهاتەکاندا هەندێك بڕوایان وایە کە "پیسی بە پیسی دەچێ" و شتی پیسی وەك پاشەڕۆکی گیانداران "ڕیخ و قشپل و قەرسەقول..." لەسەر برینەکانیان دادەنێن، کە ئەمە شتێکی بەترسە و زۆربەی ئەوانەی لە تەمەنی گەورەییدا تووشی ئەو دەردە دەبن لە ئەنجامی ئەو ڕەفتارانەوەیە).

کاتێك کە بەکتریای ئەو دەردە دەکەوێتە ناو برینێکەوە، دەست دەکا بە گەشەکردن و زۆربوون، بەتایبەتی ئەگەر برینەکە توند بپێچرێتەوە و هەوای بەرنەکەوێ، چونکە میکرۆبەکە لە شوێنی بێ هەوا (بەبێ ئۆکسجین) باشتر گەشە دەکا.

پێشان کە کوتان نەبوو، ئەو دەردە کوشندەیە لەناو کوردەواری خۆماندا زۆر باو بووە و دەبووە هۆی مردنی منداڵانی تەمەن یەك هەفتە کە لە ئەنجامی پیسبوونی برینی ناوکیان، کە

بە چەقۆ و مووس و ئامرازی پیس لەلایەن دایەنەوە دەبڕدرا، بەکتریای ئەو نەخۆشیەی تێ دەکەوت و توندیش دەپێچرایەوە، هەر دوای چەند رۆژێك منداڵەکەی دەکوشت و دەیان گوت ئەوە (شەوە) دەستی لێ وەشاندووە یان شەوە لێی داوە...!

ماوەی سەرهەڵدانی نیشانەکانی ئەو نەخۆشیە دوای پەیدابوونی بەکتریایەکە لەناو لەشدا، لەنێوان دوو رۆژ تا دوو مانگە و جاری وابووە میکرۆبەکە بۆ ماوەی چەند ساڵێك لەناو برینێك بەسستی ماوەتەوە و پاشان کە بواری بۆ رەخساوە دەستی کردووە بە گەشە و زۆربوون و ژەهر دەردان و نەخۆشیەکەی دروست کردووە.

بەکتریایەکە لەناو برینە پیسبووەکەدا دەست دەکاتە رژاندنی ژەهرێك کە دەچێتە ناو خوێنی نەخۆشەکە و تایبەتمەندیەکی هەیە بۆ خانەکانی مێشك و دەمارەکان و پێیانەوە دەنووسێ و دەبێتە هۆی خووگرتن (پەرکەم، فێهاتن، گەشکەگرتن). لە سەرەتادا نەخۆش ماسوولکەکانی نزیك دەمی کورژ دەبن، بۆیە دەمی دەقرمێ (دادەخرێ) و ناتوانێ ددانەکانی لێك دوور بخاتەوە و دەمی بکاتەوە. ئەوەندەش لەشی هەستیار دەبێ کە بە

کـەمترین دەنـگ یـان جوولـە رادەپـەڕێ. پاشـان ماسـوولکەکانی پـــشتی کـــورژ دەبـــن و پـــشتی رەق دەبـــێ و ناچـــەمێتەوەو ماسولکەکانی سینگ و نێوان پەراسووەکانی و ناوپەنـچکی کـورژ دەبن و ناجوولێنەوە و لە دواییدا هەناسەی دەوەسـتێ و دەمـرێ. ئەم نیشانانە لەگەوراندا دەبینرێن، بەڵام لە منداڵی ساوا یەکـەمجار دایك هەست دەکات منداڵەکەی مەمك ناگرێ و پاش ماوەیـەك وەك داری رەقی لێدێ تا گیان دەردەچـێ. هـیچ چارەسـەریەك بـۆ ئـەو نەخۆشیە نیە و ئەوەی بیگرێ ئاکامی مردنە چونکە کـە ژەهرەکـە بە خانەکانی لەشەوە دەنووسێ بە هیچ دەرمانێك لێیان نابێتەوە.

لەبــەر ئــەوەی هۆکــاری نەخۆشــیەکە ژەهــری بەکتریایــە، کوتــانیش بــۆ ئــەو دەردە بریتیــە لــە بــەکارهێنانی ژەهــری بەکتریایەکـە خـۆی، بـەڵام ئـەو ژەهـرە وا لێـدەکرێ کـە توانـای نەخۆشی دروستکردنی نـەمێنێ و تـەنیا دەبێتـە هـۆی واگاهێنـانی سیستەمی بەرگریی لەش بۆ ئەوەی دژەژەهری بۆ دروست بکات.

ئەم کوتانەش وەکـو کوتانەکـەی نەخۆشـیی ملـەخڕە، لەگـەڵ کوتـانی سـێیانە پێکـەوە بـە دەرزی لـە رانـی منـداڵ دەدرێ و بـە هـەمان ژمـارە فـرِ و جـاری کـە لەپێـشتر باسمـان کـرد بـەکار

دەهێنرێ، بەلاَم لەبەر ئەوەی منداڵی ساوا لە مانگی دووەمی تەمەنی دا ئەم کوتانە وەردەگرێ، پێویستە لە رۆژی لەدایك بوونیەوە بەرگریی لە لەشدا هەبێ، ئەوەش بەوە دەبێ کە دایکەکە لەکاتی دووگیانیی دا و لە مانگی چوارەمی زگەکەی دەرزی بۆ ئەو دەردە وەربگرێ، ئەوەش بە تەنیا ئامادە کراوە و بەزۆری لە قۆڵی چەپی دایکە دووگیانەکە دەدرێ و دەبێ پاش مانگێك لە دەرزی یەکەم، دەرزی دووەمیشی لێبدرێ. بەم شێوەیە دژەژەهری نەخۆشیەکەی لەناو خوێندا دروست دەبێ و ئەو دژەژەهرەش لە رێگەی هاوەڵەوە (پزدان — مشیمە) دەچێتە ناو خوێنی کۆرپەکەی ناو زگی. کە منداڵەکە لەدایك دەبێ بۆ ماوەی چەند مانگێك بەرگریەکی ئامادەکراوی دژی ئەو نەخۆشیە لەلەشدا هەیە و دەتوانێ بەرگری لەو نەخۆشیە بکات ئەگەر لەو ماوەیەدا تووشی بوو، دوای ئەوەش کاتی کوتانی تایبەتی خۆی دادێ. بۆ ئەوەی دایکەکە کوتانی تەواوی بۆ بکرێ، دوای شەش مانگ لە دەرزی دووەم، دەرزی سێیەمیشی لێبدرێ باشە، واتە دوای ئەوەی منداڵەکەی دەبێ، پاش دەرزی سێیەمیش بە ساڵێك چوارەم دەرزی وەردەگرێ و پاش ئەوەش بە پێنج ساڵان دەرزی پێنجەم. بەم جۆرە ئەو دایکە بۆ تەواوی تەمەنی بەرگری بۆ ئەو

نەخۆشـــیەی لەلەشـــدا دەبـــێ و منداڵـــەکانی دیکـــەی دوای لەدایکبوونیان لەو دەردە دەپارێزرێن تا ئـەو رۆژەی کوتانیـان بـۆ دەکرێ. ئەگەر لە یەکەم زگدا بـەم شـێوەیە ئـافرەت خـۆی کوتـا، ئـەوا پێویست ناکـات لـە زگـەکانی دیکـەدا دووبارەیـان بکاتـەوە، بەلاّم هەندێك جاران زانایانی بواری پزیشکی لەبەر ئـەوەی نـاتوانن لەوە دڵنیابن کـە دایکەکـە بـەم شـێوە رێکوپێکـە کوتانـەکانی بـۆ کراوە، چ لەبەر ئەوەی پسوولەی کوتـانی نیـە یـان بـزری کـردووە یـان لەبـەر ئـەوەی نەخوێنـدەوارە و لـەبیری نـەماوە چـۆن خـۆی کوتاوە و کەی فرەکانی وەرگرتووە... بۆیە وای بەباش دەزانن لـە هەموو زگکردنێکدا دووبارە خۆی بکوتێتەوە بە هەمان فڕ و ماوە.

کوتانی دژی نەخۆشی دەردەکۆپـان بـۆ هـەموو کەسـێك و بـۆ هەموو تەمەنێك دەبێ ئەگەر لە منداڵی نەکوترابێ، هەموو کەسـێك لەوانەیە لە ژیانیدا تووشی برینداربوون بێ و هـەر بـرینێکیش دوور نیـە پـیس بـێ و میکرۆبـی ئـەو نەخۆشـیەی تـێ بکـەوێ، بۆیـە گـەورانیش دەتـوانن خۆیـان بکـوتن بـە هـەمان شـێوەی کوتـانی ئافرەتی دووگیان.

پێویستە ئەوە بزانین کە ئەم کوتانە جیایە لـەوەی کاتێك کـە یەکێك بریندار دەبێ و دەرزی گزازی لێدەدرێ (کە پێـشتر زۆر بـاو

بوو و ئەمڕۆ لەبەر ئەو کوتانە زۆر باوی نەماوە). ئەو دەرزیەی کە بۆ بریندارێك بەکار دەهێنرێ و دەمودەست دوای بریندار بوونەکە لێی دەدرێ، ئەوە دژەژەهری ئامادەکراوە نەك کوتان. ئەمەیان بۆ ئەوەیە ئەگەر لەماوەی چەند کاتژمێرێك یان چەند رۆژێك ژەهری ئەو نەخۆشیەی لەلەشدا پەیدابوو لەبەر پیسبوونی برینەکە و هەبوونی بەکتریای گەزاز، ئەوا ئەو دژەژەهرە ئامادەکراوە بەری لێ بگرێ و نەیەڵێ بە خانەکانی مێشکیەوە بنووسێن تا ئەو کاتەی کوتانی بۆ دەکرێ و بەرگری لەناو لەش پەیدا دەکا. ئەمڕۆ لەبەر ئەوەی زۆربەی منداڵ لە گچکەییەوە دەکوترێن بۆ ئەو نەخۆشیە، بۆیە ئەو دەرزیەی گزازی دوای بریندار بوون زۆر بەکار ناهێنرێ.

## ٣- کۆخەڕەشە:

کۆکەڕەشە یان کۆخەڕەشە نەخۆشیەکی درمە و لەهەموو شوێنێکی جیهان دا هەیە و بەتەنیا تووشی مرۆیان دەبێ، بەلاّم لە لابوراتۆر (تاقیگە)دا مەیموونیشیان تووش کردووە..! زۆر بەئاسانی و بەهۆی پڕیشکی دەم و هەناسەوە بلاّودەبێتەوە و بەزۆریش تووشی مندالاّن و ساوایان دەبێ. هۆکاری ئەم نەخۆشیە بەکتریایەکی قەبارە بچووکە پێی دەگوترێ :

Bordetella Pertusis, Haemophylus Pertusis.

پاش ئەوەی میکرۆبەکە دەچێتە ناو کۆئەندامی هەناسەدان، دیواری بۆڕیەکانی هەناسە دەسووتێنێتەوە و شانەکانی لەناو دەبا و بەلّغەم لەشوێنیان دروست دەبێ. ماوەی دەرکەوتنی نیشانەکانی لەنێوان ٧ تا ١٠ رۆژ دایە و دوای ئەوە نەخۆش دەست بە پژمین دەکا و تایەکی سووکی دێتێ و نانی پێ ناخورێ و نەرمە کۆخەیەك دەگرێ. پاش یەکدوو حەفتان، کۆکەکەی توندتر و خێراتر دەبێ ئەوجا دەبێتە نۆرە کۆخە (واتە ناوە ناوە دەیگرێ) و لەناوەڕاستی نۆرەکۆخە یەك لەدوای یەکەکانی دا هەناسەیەکی قوولّی بەدەنگ هەلّدەکێشێ کە زۆر بە قیڕەی یان

قووقـەی کەڵـەباب (کەڵەشـێر) دەچـێ، بۆیـەش لـە عـارەبی بـە (السعال الديكي) ناودەبرێ.

ئـەو نـۆرە کۆخەیـە هەرچـەند خولـەکێك جارێـك دووبـارە دەبێتەوە، بەتایبەتی لە منداڵی ساوا کە زۆر دژوار و سەخت تـرە. کۆخەکە دەبێتە هۆی قووتدانی بڕێکی زۆر لە بەڵغـەمی هەڵکـەنراو بۆیە رشـانەوەیەکی زۆر تونـدی بـەدوا دا دێ کـە رێگـەی خـواردن نـادا. لەوانەیـە بەڵغەمەکـەی خوێنیـشی لەگەڵدا بـێ. لەئەنجامـدا نەخۆش وشـك هەڵدەگـەڕێ و رەنگـی زەرد و لاواز دەبـێ و ئەگـەر زوو چارە نەکرێ گیان لەدەست دەدا.

کوتانی کۆخەڕەشە بریتیە لە بـەکتریای مـردووی نەخۆشـیەکە کە لەگەڵ کوتان بۆ گزاز و ملەخڕێ پێکەوە ئامادەکراوە و بە یەك دەرزی، وەکو پێشتر باسکرا، لێدەدرێ.

کوتانی سێیانە بەگشتی بریتیە لە سـێ ملیلیتر (٣ سـی سـی) شلە و بە دەرزیەك لە چاریەکی دەرەوە (پەڕگە)ی لای سـەرەوەی ران دەدرێ. لەوانەیـە ببێتـە هـۆی تـا هـاتن کـە رۆژی یەکـەم بـۆ مـاوەی ٢٤ کاتـژمێر بـەردەوام دەبـێ. بـۆ ئـەوەش دایکوباوکـان دەتوانن دەرمانی تادابەزانـدن بدەنـە منداڵەکـەیان یەکـسەر پـاش

کوتانەکە، ئەوجا چ بەشێوەی فتیلە بێ و بەدامەن پێی هەڵگیرێ یان خواردنەوە. لەوانەیە شوێنی دەرزیی کوتانەکە ئازاری هەبێ و کەمێك ئەستووریش بێت. ئەمە جێی ترس نیە و هەر دوای چەند ڕۆژێك نامێنێ. بەڵام ئەگەر دوای حەفتەیەك لەکوتانەکە ئازاری ما و ئاوسانەکەی نەنیشتەوە و سوورهەڵگەڕا، دەبێ پزیشك ببینێ چونکە لەوانەیە کێمی پەیدا کردبێ.

هەندێك جار کاردانەوەی توند لە هەندێك منداڵ پەیدا دەبێ بۆ ئەو کوتانە، ئەویش بەزۆری بەهۆی میکرۆبی کۆخەڕەشەکەیە و لەوانەیە منداڵەکە پەرکەم (خوو، گەشکە) بگرێ. ئەگەر ئەمە ڕوویدا ئەوا پێویستە دەرزی دیکەی جارێکە دیکە لێ نەدرێ ئەگەر کوتانی کۆخەڕەشەی لەگەڵ بوو. ئەو کوتانە نابێ بدرێتە ئەو منداڵانەی پەرکەمدارن (خوودارن) بەڵکو کوتانی دووانە هەیە کە تەنیا ڤاکسینی گزاز و ملەخڕەی تێدایە و بەتەنیا بۆ ئەو منداڵانە بەکار دەهێنرێ.

## سۆریکە

سۆریکە یان سووریژە Measles نەخۆشییەکی تیژی ناسراوە و زۆر بلاوە. لەکۆنەوە هەر هەبووە بەلام بەربلاویەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پەیدابوونی شاری گەورە و شوێنی نیشتەجێی چڕ و قەرەباڵغ.

هۆکاری ئەم نەخۆشیە ڤایرەسە کە لە ڕێی پرپیشکی دەم و لووت و هەناسەوە لە نەخۆشانەوە بۆ لەش ساغان دەگوازرێتەوە. لەوانەیە میکرۆبەکە لە هەواشدا هەبێ. زانایان لەو بڕوایەدان کە ڤایرەسەکە لە سەرەتادا لەناو کۆئەندامی هەناسەدان زۆر دەبێ و پەرەدەسێنێ ئەوجا دەچێتە بەشەکانی دیکەی لەش بەهۆی خوێنەوە. لەو ڕۆژەی کە ڤایرەسەکە دەچێتە ناو لەشەوە تا ئەو کاتەی نیشانەکانی نەخۆشیەکە دەردەکەون ٩ تا ١١ ڕۆژ دەخایەنێ، هەتا ئەو کاتەش کە پەڵە لەسەر پێست دەردەکەوێ دوو هەفتەی دیکەی دەوێ.

نیشانە سەرەتاییەکانی سۆریکە بریتین لە: بێهێزی، تا، سووتانەوەی ناو چاوەکان و لێڵبوونیان و فرمێسک کردنێکی زۆر و

ئاوسانی پێڵوەکان و نەخۆش لەو کاتە لە ڕووناکی دەترسێ و کۆکەیەکی وشکی دەبێ و چڵم لە لووتی دێتە خوارێ...

ئەو نیشانانە سێ چوار ڕۆژان دەخایەنن ئەوجا ئەگەر بەوردی سەیری ناو دەمی نەخۆشەکە بکەین دەبینین لەسەر پەردە لینجەکەی ناو دەمی و بەتایبەتی ناو گوپی و لەئاست ددانەکانی دواوەیدا دەنکی سووری بچووکی نارێك، کە لەناوەڕاستیاندا خاڵێکی سپی هەیە وەکو دەنکە شەکر دەردەکەون. بەو دەنکانە دەگوترێ دەنکۆڵەی (کۆپلیك Koplik's Spot). کە ئەو دەنکۆلانە بینران ئەوا لە پەیدابوونی نەخۆشیەکە دڵنیا دەبین. یەکدوو ڕۆژی دواتر پەڵەکانی سەر پێست بەدیار دەکەون، ئەوانیش لە سەرەتادا لە نێوچەوان و بەرەو خوار بۆ دەموچاو و مل و سینگ و زگ وردە وردە پەرت دەبن، تا دەگەنە قاچەکان. ئەو پەلانە لەهەر شوێنێك بۆ ماوەی سێ ڕۆژ دەمێننەوە، ئەوجا بە هەمان شێوەی دەرکەوتنیان ڕەش دەبنەوە و نامێنن. هەمووی نزیکەی یەك حەفتە دەخایەنێ.

نەخۆشیی سۆریکە بەخۆی و بەبێ چارەسەری چاك دەبێتەوە ئەگەر تووشی ماك و ئالۆزی دیکەی نەكات، وەك: سووتانەوەی سیپەلاکەکان یان تووشی مێشك بێت.

ئەوەی تێبینی کراوە سۆریکە لەو شوێنانەی کە کوتانیان لێ ناکرێ لە بەهاراندا زۆرتر پەیدا دەبێ و هەر دوو سالأن یان سێ سالأن جارێك بە بەربلأوی و وەکو پەتایەك دەردەکەوێ و خەڵکێکی زۆر، بەتایبەتی مندالأن تووشی دەبن. هەر کەسێك جارێك سۆریکەی گرت بۆ جاری دووەم تووشی نایێتەوە و بەزۆریش لە تەمەنی پێش پازدە ساڵی دا مندالأن تووشی دەبن. تاکە چارەسەریەك بۆ نەخۆشی سۆریکە ئەگەر هەبێ، ئەوا خۆپاراستنە لێی ئەویش هەر بە کوتان دەکرێ.

کوتانی سۆریکە بریتیە لە ڤایرەسی سۆریکەی زیندوو کە بێهێز و لاواز کراوە و بەشێوەی تۆز ئامادەکرێ و لەکاتی بەکارهێنانیدا بەشلەی (ئاو) تایبەتیی خۆی دەگیرێتەوە و بە دەرزی لەژێر پێست دەدرێ و لە قۆڵی چەپە و بەبری نیو ملیلیتر (نیو سی سی). لە تەمەنی نۆ مانگیدا ئەو کوتانە بکرێ باشە

چونکه بەزۆری منداڵ لەدوای تەمەنی یەك ساڵی تووشی دێ و پێش ئەو تەمەنە دەگمەنە.

واباشە بۆ چوست و چالاککردنی بەرگریی لەش دژی سۆریکە، لە تەمەنی پازدە مانگیشدا دەرزیەکی دیکە وەربگرێ. لەوانەیە منداڵەکە پاش شەش تا دە ڕۆژان لەو کوتانە تای بێتێ و بۆ ماوەی یەك تا سێ ڕۆژان درێژە بکێشێ، لەوانەشە پەڵەی وەکو هی نەخۆشیەکە لەسەر پێستی پەیدا ببێ، بەڵام کەمتر و سووکترە. ئەوانە هیچ مەترسیەکیان بۆ منداڵەکە نیە و بۆ تایەکەش دەرمانی تا دابەزاندن دەکرێ بەکار بهێنرێ. هەر منداڵێك ئەگەر گومانی ئەوەی لێکرا کە تووشی نەخۆشیی سۆریکە بووە، دەکرێ کوتانی بۆ بکرێ و هیچ زیانیشی نابێ و باشترە بکوترێ نەوەك راست نەبێ و سۆریکەی پێشتر نەگرتبێ. هیچ بەربەست و ئاستەنگێکیش نیە ڕێ لەکوتانی منداڵ بگرێ بۆ کوتان بەو ڤاکسینە.

هەندێك جاران ڤاکسینی سۆریکە لەگەڵ ڤاکسینی دوو نەخۆشیی دیکە تێکەڵ دەکرێن و پێکەوە بەکار دەهێنرێن. ئەو دوو نەخۆشیەش گوێ ڕەپە (نکاف Mumps) و نەخۆشیەکەی

دیکـە کـە وەکـو سـۆریکە وایـە بـەلاّم جیـاوازە و پێـی دەگـوترێ سۆریکەی ئەڵمانی (Rubella). کوتانەکە ناوی (MMR) ە کە پیتـی یەکـەمی نـاوی هەرسـێ نەخۆشـیەکە. ئـەو جـۆرە کوتانـە تێکەلاّوە هەموو کاتێك دەست ناکەوێ و تـەنیا لـە تەمـەنی پـازدە مانگی لێـدەدرێ . وا لێـرە بـەکورتی باسـی ئـەو دوو نەخۆشـیەش دەکەین.

## گوێ ڕەپە

نەخۆشیەکی درمە و هۆکارەکەی ڤایرەسێکە کە تووشی هەموو بەشەکانی لەش دێ، بەتایبەتی گلاندەکانی لیکاو کە دەبێتە هۆی ئاوسانیان، بەزۆریش گلاندەکانی بناگوێیەکان، هەر بۆیەش لەکوردی ناوی گوێڕەپەی Mumps لێنراوە چونکە بە ئەستووربوونی ئەو گلاندانە گوێیەکان قیت و ڕەپ رادەوەستن.
ئەم دەردە لەهەندێ شوێناندا بەبەردەوامی نیشتەجێیە (متوطن Endemic) بەلام هەندێك جار وەکو پەتایەك لەناو شارە قەرەبلغەکاندا بلاودەبێتەوە و بەزۆری لە دوادوای وەرزی زستان و لە بەهاراندا دەبینرێ. لەهەموو تەمەنێك دەیگرن بەلام زۆربەی جار تەمەنی (٥ – ١٥) ساڵی تووشی دەبن. بەدەگمەن لەمنداڵی تەمەن دووساڵی یان کەمتر روو دەدات و منداڵی ساوا تا تەمەنی یەك ساڵی بەرگری هەیە و تووشی نایێ.

میکرۆبی ئەو نەخۆشیە لە ڕێگەی پڕووشکی دەم و بەکارهێنانی کەلوپەلی نەخۆشەوە دەگوازرێتەوە. باوەڕ وایە لە دەمیشەوە بچێتە ناو لەشەوە. پاش (٢ تا ٤) حەفتە نیشانەکانی دەست دەکەن بە دەرکەوتن و لە سەرەتادا سەرئێشە، لەرز، بێهێزی لەگەڵ نچەتایەك کە نەخۆش دەیگرێ و پاش ٢٤

کاتــژمێران گلاندەکانی لیکـاو دەئاوسـێن کـە لەوانەیـە لـەکاتی پارووجوین دا ئازاریان لێ پەیدا ببیٚ یان کاتێـك کـە شـتێکی تـرش دەخوا، چونکە دەبێتە هـۆی وررووژانـدنی گلانـدەکان بـۆ دەردانـی لیکـــــاو و ئەمـــــەش ژان و ئازاریـــــان لێ پەیـــــدا دەکـــــا. هەنـدێك جـار ئەندامـەکانی زاووزێـش تووشـی سـووتانەوە دەبـن، وەك: هێلکە گونەکان لە کوڕان و هێلکەدانەکان لە کچان. ئەو کاتە ئەگەر ئەمە روویدا ئەوا لەوانەیە لەدوا رۆژدا ببێتـە هـۆی نـەزۆکی. جاری وا بووە پەنکریاسیش تووشی ئەو میکرۆبـە بـووە و بووەتـە هۆی سووتانەوەی.

نەخۆشـەکە لـەماوەی چـەند رۆژێکـدا چـاك دەبێتـەوە ئەگـەر تووشـی ئـاڵۆزیی دیکـە نـەبیٚ. هـیچ چارەسـەریەکی بنـبڕ بـۆ ئـەو نەخۆشیە نیە و تەنیا رێگا خۆپاراستنە لێی، کـە ئـەویش هـەر بـە کوتان دەکریٚ. کوتانەکەش بریتیە لـە ڤایرەسـی نەخۆشـیەکە کـە لاواز و بـیٚ توانـا کـراوە و لەگـەڵ کوتـانی سـۆریکە و سـۆریکەی ئـەڵمانی پێکـەوە و بـە دەرزی لێـدەدرێت لـە دوای تەمـەنی یـەك ساڵی و تەنیا بۆ یەك جارە.

## سۆریکەی ئەڵمانی

سۆریکەی ئەڵمانی Rubella بە تەنیا وەك نەخۆشیەك زۆر گرنگ و بەترس نیە چونکە زۆر بەسووکی نەخۆش دەیگرێ و زۆرجاران هەر هەستیشی پێناکرێ، بەڵام ترسناکیەکەی ئەو دەردە لەوەدایە کاتێك کە تووشی ژنێکی دووگیان دەبێ، چونکە کار لە دروسبوون و پێگەیشتنی کۆرپەکەی دەکا.

هۆکارەکەی ئەو نەخۆشیەش ڤایرەسە و ئەگەر تووشی ئافرەتێکی زگپڕ بوو، بەتایبەتی لە سێ مانگی یەکەمی زگەکەی، ئەوا کۆرپەکەی تووشی زۆر ناتەواوی جەستەی دەکا و لەوانەیە زگەکەی لەبەر بچێ یان منداڵەکەی بە مردوویێتی ببێ یان تووشی هەندێك ناتەواوی جەستەیی بێ وەك: کوێربوون، نەبوونی دەستێك یان قاچێکی...تد. بۆیە کوتان بۆ ئەو نەخۆشیە تەنیا بۆ کچان دەکرێ بەتایبەتی ئەوانەی کە لە تەمەنی مێردکردندان.

زۆرجار وەکو بەرنامە لەکاتی هەبوونی ئەو ڤاکسینە، ئەو کچانەی لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی (بنەڕەتی) دەردەچن بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی (حەفتەمی بنەڕەتی) دەکوترێن.

کوتانەکەش بەتەنیا دەبێ، بەڵام بۆ منداڵان دوای تەمەنی یەک ساڵ لەگەڵ کوتانی سۆریکە و سۆریکەی ئەڵمانی German Measles پێکەوە بەدەرزی و بۆ تەنیا یەک جار (یەک فڕ) دەبێ.

## گوتەی کۆتایی

دایکی دڵسۆز.. باوکی ژیر..

بەم شێوەیە و پاش کوتانی منداڵەکەت بە هەر شەش جۆرە کوتانەکان دژی هەر شەش نەخۆشیە درمەکانی منداڵان لە ساڵی یەکەمی تەمەنی تا پێنج ساڵ تەواو دەکا، دەتوانی بڵێی بەتەواوی لەو شەش نەخۆشیە ترسناکانەت پاراستووە.

بێگومان کوتان بۆ زۆر نەخۆشی دیکەش هەیە، لەوانە سووتانەوەی جەرگ، کۆلێرا، تایفۆید (گرانەتا)،...تد. بەڵام ئەوانە لە هەموو کاتێك دەست ناکەون و بۆ هەموو کەسێکیش پێویست نین، بەزۆریش کوتانەکانیان کاریگەر نین و بۆ ماوەیەکی کورت دەمێننەوە، بەڵام ئەو شەش نەخۆشیەی باسمان کردن زۆر پێویستە منداڵانیان لێ بپارێزین بەکوتان چونکە دەبنە هۆی نەخۆشی ترسناك و پەکەوتن و تەنانەت مردنیش. دەبێ ئەوەش لەلایەن دایکان و باوکانەوە روون و ئاشکرا بێ کە نیشانەی تێگەیشتن و پێشکەوتن و خەمخۆریی هەر گەل و وڵاتێك بەندە بە رادەی لەش ساغی و رێژەی مردنی منداڵانی لە ساڵانی (١ تا ٥) ی تەمەنیان.

لەکۆتاییدا هیواداریین بەم نامیلکەیە شتێکی بەسوودمان پێشکەش جگەرگۆشەکانمان کردبێ کە هیوا و ئاواتی دوا رۆژی ئێمەن.

ئیتر هەر ساغ و سەرکەوتووبن

## خشتەیەك بۆ دیاریكردنی جۆر و مێژوو و شوێنی كوتانەكانی منداڵەكەت

| ناوی كوتان | مێژووی كوتان | شوێنی كوتان | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| بی سی جی | | | |
| ئیفلیجی (سفر) | | | |
| ئیفلیجی یەكەم .......... | | | |
| ئیفلیجی دووەم .......... | | | |
| ئیفلیجی سێیەم .......... | | | |
| ئیفلیجی چوستی یەكەم | | | |
| ئیفلیجی چوستی دووم | | | |
| سێیانەی یەكەم ........ | | | |
| سێیانەی دووەم ........ | | | |
| سێیانەی سێیەم ....... | | | |
| سێیانەی چوستی یەكەم | | | |
| سێیانەی چوستی دووەم | | | |
| سۆریكەوسۆریكەی ئەڵمانی | | | |